﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ خُذُواْ حِذْرَكُمْ فَانفِرُواْ ثُبَاتٍ أَوِانفِرُواْ جَمِيعاً﴾
النساء / ٧١

# لێكۆڵینەوەو

## چۆنێتی ڕووبەڕووبونەوەی

ئامادەكردنی
پێگەی گزنگ



# پێشدەست

# برا هاوڕێگەو هاوبیرم

بزانە کە ئەم ئوسلوب و شێوازە ئەمنیانە پێویستی بەئاستێکی بەرزو بەرچاو لەهۆشیاری شەرعی و پەروەردەی ئیمانی و رۆشنبیری کەونی هەیە، وە ئەوەش بزانە کە هەرگیز بە ساویلکەیی و بێ ئاگایی و سادەیی و پاڵدانەوە ناتوانرێت سەروەری و شاکاری ئیسلامی بنیاد بنرێت و سەربەرزی و کەرامەتی زەوتکراو بگێڕدرێتەوە بۆ موسوڵمانان

بێگومان هەستکردن بەبنەماکانی زامنکردنی کاری ئیسلامی و هۆشیاری ورد لەمەڕ داخوازییەکانی، وە شارەزایی لەو بنەمایانەی کە چاودێری بەردەوام و، خوێندنەوەی دروستی دەبێت بۆ سروشتی مەنهەج و سروشتی قۆناغ و، سروشتی رەوش و کەش و هەوای ناوچەکەو، سروشتی دوژمنەکان، کارەکە دەخاتە بازنەی چاوکراوەیی و هۆشیاری و پارێزکاریەوە

بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین: (نهێنی لە جموجوڵدا – پاراستنی ئەمانەتی کۆبونەوەکان – پەنهانکاری – پاشەکشەکردن لەشەڕە لاوەکییەکان – وازهێنان لە خەمساردی لەمەڕ زانیارییەکان و خۆپێوەهەڵکێشان و بەخشینەوەیان – خۆسازاندن بە شێوەیەکی گونجاو لەگەڵ داخوازییە هەنوکەییەکانی واقیعدا) لە ئەلف و بێی بنەما ئەمنیەکانن.

دۆزینەوەی هاوسەنگییەکی ورد لەنێوانی گرتنەبەری رێوشوێنە ئەمنیەکان و بەردەوامی لەکارکردندا زامنی گەیشتنمانە بەئامانجەکان – بەویستی خوا – ئەویش بەچوڵنەکردنی سەنگەری جوهدوو جیهادوو کارکردن، وە پەنا نەبردنەبەر خۆدزینەوەو وازهێنان و دانیشتن هەرچەندە قۆناغەکان سەختترو قوربانییەکان گرانبەهاتربن. وە هەڵوێستی دروست و رەوا بەو شێوە دەبێت کەکارکردنمان لەگەڵ داخوازییە هەنوکەییەکانی واقیعدا بسازێنین، سازاندنێك کە ماناکانی نەبەردی و خۆڕاگری و پێچەسپاوی لەخۆبگرێت و لەهەمانکاتدا ئاوێتە بوبێت لەگەڵ هەستەکانی هۆشیاری و ژیری و چاوکراوەیدا



# لێکۆڵینەوە

## پێناسەی لێکۆڵینەوە:

لێکۆڵینەوە: بریتیە لەگرتنە بەری سەرجەم ڕێگەکانو، بەکارهێنانی گشت هۆکارەکان، بەمەبەستی وەرگرتنی زانیاری لەکەسی بەندکراو، بەشێیوەکانی:( ڕاکێشان (استدراج)، هەژاندنو دەمارگرتن (استفزاز)، تورەکردن (ابتزاز)، گوشارو تۆقاندن، فریودان، ئارەزوو خستنەبەر (الترغیب)و زۆرلێکردن (الإکراه)...). شایانی باسە لێکۆڵینەوە بە یەکێك لەڕێگەکانی کۆکردنەوەی زانیاری دادەنرێت.

## بەشی یەکەم
## هۆکانی لێکۆڵینەوە ( أسباب التحقیق ).

یەکەم: (بونی گومان لە بەندکراو) بە هۆی یەکێك لەم حاڵەتانەی خوارەوە:

- بوونی پەیوەندی گوماناوی لەگەڵ کەسانیك کە پێش خۆی گیرابن یان لەڕوی ئەمنیەوە سوتابن.
- هاتوچۆکردنی، یان بونی لە ناوچە سوتاوەکان یان گوماناویەکان کە لەژێر چاودێری دەزگا ئەمنیەکاندابن وەك: (شوێنی تەقینەوەکان، مزگەوت ، ناوچەی موجاهیدان ،...هتد).
- ڕواڵەتو شێوازی سەرنج ڕاکێشو نامۆ بە نەریتی ناوچەکە.
- زۆر بلێیی و ئارەزوی خۆدەرخستن.
- هاندان بەشێوەیەکی ئاشکرا بۆ ڕوبەڕوو بوونەوەی دوژمنانو هاوکاری بەرهەڵستکارانیان.

دووەم، (بونی بەڵگەی حاشا هەڵنەگر) بە هۆی یەکێك لەم حاڵانەی خوارەوە:

- ▽ دەستگیرکردنی لەکاتی جێبەجێکردنی کارو چالاکی، یان بونی شوێنەوارەکانی بەسەریەوە.
- ▽ دەستبەسەراگرتنی هەندێ بەڵگەنامە لەشوێنی ڕوداوێك کە ببێتە هۆی ناسینەوەی.
- ▽ دەسکەوتنی هەندێ بەڵگەنامە بە کەسی گیراو، یان لەماڵی یان لە سەیارەکەیدا یان....هتد
- ▽ دانپیانانەکان (اعترافات) لە لایەن هاوکارانی، یان هاوپەیمانانی، یان هەواڵ لێدانی لەلایەن سیخورو مونافیقانەوە.
- ▽ پێوەگیرانی بەڵگەنامەی ساختەکراو.
- ▽ خەم ساردی لەپاراستنی نهینیەکان و درکاندنیان.
- ▽ بوونی شایەتی لەسەری لەدەرەوەی کارەکەی خۆی.
- ▽ بونی کەلێن و درزەکردنی بەرامبەر بۆناوڕیزەکان (الإختراق)، یان کەسانی بەکرێگیراو لەریکخراوەکەدا.
- ▽ بونی چاودێری یان سیخوڕی بەسەریەوە لەرێگەی هۆکارە فەنییەکانی وەك (تەلەفۆن، مۆبایل، ئامیرەکانی سیخوری).

# بەشی دووەم:
# قۆناغەکانی لێکۆڵینەوە

**قۆناغی یەکەم، قۆناغی ئاشنابون و خوێندنەوەی دەرونی و هەستی دڵی بەندکراوز:**

لەم قۆناغەدا لێکۆڵەر (المحقق) بۆ ناسین و شارەزابوون لەحاڵی دەروونی بەندکراوو، بۆ ئاشنابون بەخاڵە بەهێزو لاوازەکانی، وەزانینی ئەوشتەی بەندکراو دەترسێنێت و، ئەوەشی نایترسێنیّ، وە چ شتانێك لە ئوسلوبە دەرونی و جەستەییەکان کاریگەیان لەسەری هەیە، وە ئاگاداربوون لە خاڵە لاوازەکانی جەستەی بەندکراو وەك: (نەخۆشییە هەمیشەییەکان و، شوێنی نەشتەرگەری و، شکاوی و...).

ئامانج لەم قۆناغە: لەم قۆناغەدا چەند ئامانجێکی دیاریکروا هەیە لەوانە:

∇ کاملْ بونی زانیاری لەبارەی کەسێتی بەندکراو.

∇ ئاشنا بوون لەباری دەرونی بەندکراو(لێدانی ترپەی دڵی) کەلێنەکانی.

∇ ڕێخۆشکردن بۆ قۆناغەکانی دواتر.

∇ ئاشنا بوون بە ئوسلوب و شێوازی کاریگەر لەسەر بەندکراو، دانانی پلانی شیاو بۆ لیکۆڵینەوە لەگەڵی.

**قۆناغی دووەم، قۆناغی زیادکردنی پلەی فشار (الضغط التصاعدی):**

دەکرێت ئەم قۆناغە بەقۆناغی ڕوبەڕوو بوونەوە ناو ببرێت، لەکاتیکدا لێکۆڵەر دەستدەکات بە بەکارهینانی هێزو گوشار لەسەر بەندکراو بە مەبەستی دانپیانان (اعتراف) بە یەکێك لەم دوو ڕێگەیە:

∇ خستنە ڕوی بەڵگەکان بەشێوەی ڕاستەوخۆ لەسەرخۆی.

وەك ئەوەی بە ناوی خوازراو - نهێنی - ت ناوت بێنیْ بۆ ئەوەی بتخاتە حاڵەتی سەرسامبونەوە، یان باسکردنی چەند کاریکی نهێنی کە پێی هەستابیت، یان ناوهێنای



رەمز یان ناوی شانەو پۆلەکەت .. لەگەڵ تێبینیکردنی ئەو گۆڕانکاریانەی لەسەر روومەت و دەمو چاوت دەردەکەویت، وە هەوڵدەدات بە هێمنانە قایلتبکات کە لیکۆڵینەوە لەم قۆناغەدا کۆتایی پێ هاتووەو، هەموو شت گەیوەتە بنبەست بەرلە دەسکردن بەلێکۆڵینەوەی کرداری، بۆیە باشوایە خۆت نەخەیتە سەنگەری جەنگێکی دۆڕاوەوە، گەرنا تۆ کەسێکی نەفام و ساویلکەیت و بەرژەوەندی خۆت نازانیت.

∇ ڕووبەڕووبونەوەت بەو بارە (واقیعە) سەخت و دژاوەرەی تێیدا دەژی.

کەسی لێکۆڵەر پلەپلە دەستدەکات بەقورسکردن و، چڕکردنەوەی ئەشکەنجەدان لەسەرت، بە شێوەی هەڵکشان (تصاعدی) بۆ ئەوەی توشی داروخانی دەرونیت بکات و، کۆتای بەصەبرو ئارامگریت بێنێ، وە تێتبگەیەنێ کە ئەمە هێشا سەرەتایەو بەدڵنیایی لێکۆڵەرتوانای زیادکردن و، بەردەوامی لەم جۆرە ئەشکەنجەی هەیەو، تۆش لەبەرامبەردا توانای هەڵگرتنی ئەم بارە قورسەت نییە، وەئەمە جەنگێکی دریژخایەنەو سنوری کۆتای نایەت و، گەر ئەمرۆش توانای خۆراگرتنت هەبێ سبەی بەرگەی لەوەزیاتر ناگری.

**قۆناغی سێیەم، قۆناغی ئەوپەڕی فشارو بەکارهێنانی توندوو تیژی:**

لەم قۆناغەدا لێکۆڵەر هەوڵدەدات بەندکراو لەوە دڵنیا بکاتەوە کە لەبەرامبەری ئەو ئازارو ئەشکەنجانەدا هیچ دەربازی ناکات تەنها دان پیانان نەبیت و بەس، وەئەم ئەشکەنجەدانەشی بەردەوام لە زیادبووندایە تا بەندکراو ئیعتراف دەکات.

**قۆناغی چوارەم، قۆناغی پەنا بردنە بەر کات:**

لەم قۆناغەدا بەندکراو فرێدەدرێتە زیندانێکی تاکە کەسی (انفرادی) و (بە دەست و قاچ و چاوی بەستراوەوە، یان تورەکەیەکی لەسەر دەکرێ بۆ ماوەیەکی درێژخایەن لەسەر کورسییەك دادەنریت) وایتێدەگەیەنن کە ئەم حاڵە کۆتای نایەت و، تەنها دانپیانان نەبیت هیچ شتێکیی دیکە دەربازی ناکات، وە هەندێ جار پشوییەکی کورت لەئەشکەنجەدان دەدرێتە بەنکراو،ئەویش لە کاتیکدا کە لێکۆڵەر هەستی بەنەبەردیی و ورەبەرزی بەندکراوکرد لەبەرامبەر ئەشکەنجەدانی، بەجۆێك کە ئەشکەنجەدان هیچ کارێکی لێناکات، یان بەهۆی دارمانی باری تەندروستی بەندکراوەوە.

## قۆناغی پێنجەم: قۆناغی گەڕانەوە بۆ ئەشکەنجەو توندو تیژی:

ئەم قۆناغەش بریتیە لەگەڕانەوە بۆ گرتنەبەری ڕێگەی توندوتیژی بەرامبەر بەندکراو، ئەم کارەش بۆ ئەوەیە کە بەندکراو دڵنیابێت لەوەی کە لێکۆڵەر زۆر بەحەوسەڵەو نەفەس درێژەو لەسزادانی بەردەوام دەبێت تا دانبەتاوانەکەیدا دەنێت، وە لەبەرامبەردا بەندکراو ماوەیەکی درێژخایەنی لەپێشەو، فشارو ئەشکەنجەدانیش سنورێکی دیاریکراوی نییە، بۆیە هیچ هیوایەك بۆ ڕزگاربون نییە تەنها دانپیانان نەبێت، وەخۆڕاگرتن‌و دانبەخۆداگرتن هیچ سودیکی نابێت چونکە ئەم حاڵە سنوریکی دیاریکراو بۆ کۆتای هاتنی نییە.

## قۆناغی شەشەم، قۆناغی کۆتای

لەم قۆناغەدا دوا ووتەی بەندکراو بەرزدەکرێتەوە بۆ بەردەم دادوەر ئەویش بڕیاری کۆتایی بە بەندکردن یان ئازاد کردنی لەسەر دەدات، وەزۆرجاریش لەپاش بڕیاری دادگا یان ئازادکردن کەسەکە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو دەخریتە ژێرچاودێریکردنەوە.



# بەشی سێیەم
# شێوازەکانی لێکۆڵینەوە

مەبەست لە شێوازەکانی لێکۆڵینەوە ئەو ڕێگەو شێوازانەیە کە لێکۆڵەر بەمەبەستی دانپیانان‌و، وەرگرتنی زانیاری بەکاریان دێنێت. جێگەی ئاماژەیە کە لێکۆڵەر لەماوەی لێکۆڵینەوەدا پەنادەباتەبەر هەمووشێوەکانی لێکۆڵینەوە، بەڵام زیاتر گرنگی دەدات بەو شێوازەیان کەگاریگەری زیاتری لەسەر بەنکراو دەبێت.

## شێوازی یەکەم:
## شێوازە دەروونیەکان

ئەمیش چەند شێوەی هەیە:

**شیوەی یەکەم: قایلکردن بە دانپیانان** (الاقناع بالإعتراف):

لێکۆڵەر بۆ قایلکردنی بەندکراو بە دانپیانان پشت بە یەکێك لەم شێوازانەی خوارەوە دەبەستێت:-

- شێوازی پەنابردنە بەر عەقل‌و ژیری: بە جۆریك لێکۆڵەر هەوڵدەدات بەندکراو بەوە قایلبکات کە هەموو شت لە بارەیەوە دەزانێت‌و، ئەو زۆر دڵنیایە لەو زانیاریانەی لەبەردەستیدایە، وەتەنها ئەو زانیاریانەشە بۆتە هۆکاری دەستگیرکردن‌و لیکۆڵینەوە لە گەڵی‌و، پاشان ئەشکەنجەدانی، گەرنا لەنیوانی ئەو لێکۆڵەردا هیچ جۆرە پەیوەندییەکی نەدۆستایەتی وەنەدووژمانیەتی نییەو، بەڵکە هەر نایشیناسیت.

وەنمونەی ئەم پرسیارانە ئاراستەی بەند کراو دەکات: ئایا پیشتر تۆم ناسیوە؟ هیچ شتیك هەیە لە نیوانماندا؟ بۆچی براکەتم نەگرتووە؟ یان دراوسێکەت؟ یان هاوڕێکەت؟ وە دەستدەکات بەهەوڵی قایلکردنی بەندکراو بە شێوەیەك کە کارەکە کۆتایی پێهاتووەو هەمووشت یەکلابۆتەوە، تۆش ئەمڕۆبیت یان سبەی دان بەهەموو ئەمانەدا دەنێیت‌و، تەنها خۆت‌و کەس‌و کارت تووشی دەردە سەری دەکەیت، وەبێگومان لێکۆڵەر هیچ زیانێك ناکات، وە گرنگ نییە بەلایەوە ئێستە دانبەتاوانەکەدا دەنێیت یان پاش ساڵیکی

تر، وەدەزگاكانی هەواڵگری گەر هێندە دڵنیا نەبوایە كە بەندكراو تاونبارە ئەو هەمو توانا و كۆششیان لەو پێناوەدا نەدەخستە گەڕو كەسی لێكۆڵەرو دەستەی لێكۆڵینەوەی بەو كارەوە سەرقاڵنەدەكردوو، وەبەتەنها لەنێو ئەو خەڵكەدا ئەوی دەستگیرنەدەكرد..!! وە هەروەها وەدەستدەكات بەگێڕانەوەی چەند ڕووداوێك كە لەماناو ناوەڕۆكدا ئەوە دەردەخەن كە ئیعتراف نەكردن لەسەرەتاوە هیچ مانایەكی نییە جگەلەوەی خۆت ئەشكەنجەی خۆت دەدەیو، هەموو هەوڵەكان بۆ خۆدزینەوە لە دانپیانان هیچ جیاوازیەكی نییە لەگەڵ بەرگرتنی خۆر بە بێژەنگ.

∇ **شێوازی دۆستایەتی و هاوەڕیایەتی**: بە جۆریك لێكۆڵەر بە ئسلوبی لەسەرخۆیو هێمنانە وەك هاوڕێیو دۆستێكی بەندكراو خۆی دەخاتەڕوو، سۆزو بەزەیی خۆی بۆ دەردەبڕێ، لەسەرەتادا دەستدەكات بەپیاهەڵدانو بە باسكردنی چاكەكانی، وەباس لە خۆڕاگرییو ئارامگری دەكات، وەباسی خراپەی ئەو لێكۆڵەرانە دەكات كە هەستاون بەئەشكەنجەدانی، وە دەرمانو خواردنی بۆ دابیندەكاتو، كار ئاسانی بۆ دەكات، لە پاشان ئەمە ژەهری بۆ لەهەنگوین دەكات، بەجۆریك دەستدەكات بەئامۆژگاریكردنی كە بەزەیی بەخۆدا بێتەوەو رەحمێك بە دایكو كەسو خیزانەكەی بكات، وە تێیدەگەیەنێت كە ئەو مافی خۆیەتی بەرهەڵستكاری داگیركەران بكاتو، خۆڕاگربێتو داكۆكی لە مافەكانی بكات، بەڵام هەموو كەس توانا و وزەیەكی دیاریكراوی هەیە .. وە بۆ زیاتر سەرنج ڕاكێشانی دەسدەكات بەهێنانەوەی بەڵگە شەرعییەكان لەمەڕ نادروستی خۆبەهیلاك بردنو هەڵنەگرتنی كۆڵێك كە لە توانادا نەبێت، وەهەوڵدەدات لەوە دڵنیای بكاتەوە كە لێكۆڵەران زانیاری تەواویان لەباری ئەوەوە لەلایە گەرنا ڕووبەڕوی ئەشكەنجەی لەو جۆرە نەدەبوویەوە، پاشان پەیمانی پێدەداتو سوێندی گەورەی بۆ دەخوات كە لەكاتێكدا ئەگەر ئیعتیراف بكات هاوكاری بكات لە سوككردنی حوكمەكەی ، هەرچەندە ئەو نایەوێت ئیعتیراف بكا، بەڵام بەهۆی دڵپێسوتانو بەزەیی پێدا هاتنەوەی كە لەئەجامی ئەو ئەشكەنجەی ڕووبەڕوی دەبێتەوە ئەم ئامۆژكاریانەی دەكان، چونكە دەزانێت ئەو ئەشكەنجەو ئازارەی ڕووبەڕوی دەبێتەوە زۆر لەوەی پێشتر

قورسترەو ئەویش بەرگەی ناگرێت، وە ڕێنمونی دەکات کەدان بەهەندێ شتی لاوەکی و ئاسایدا بنێت نەك هەمو شتەکان ئەمەش تەنها لەپێناوی سوککردنی ئەشکەنجەکەی.

▽ شێوازی سادەکردنەوە: ئەمەش شێوەیەکە لە شێوەکانی قایلکردن بەفریودان، کە پشتدەبەستێت بەسادەکردنەوەی بابەتی دانپیانان ئەویش بەچەند ڕێگەیەك لەوانە:

▽ دڵنیابە لەوەی زۆربەی ئەوانەی لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ کراوە ئیعتیرافیان کردووە تەنانەت سەرکردەکانیش، خەڵکانێك کە بە جەستە زۆر لەو هەڵکەوتوترو بەهێزتر بون، وە علم و ئاستی زانیارییان لەو زیاتر بوە، وە ئەزمونیان لە لێکۆڵینەوەدا زۆر لەو زیاتربووە، وە زانیاری و نهێنی گەورەترو مەترسیدارتریشیان لەلابووە، وە کێشەکەیان گەلێك لە کێشەکەی ئەو گەورەتر بووە، وە ئەو حوکمەی ئەوان بەسەریاندا دراوە چەند بەرابەری ئەو حوکمەیە کە چاوەڕێی ئەو دەکات.

▽ وانیشانیدەدات کە ئەو تۆمەتەی ڕوبەڕوی کراوەتەوە ئاسانە، وە حوکمەکەی زۆر ئاسانەو لەماوەی لێکۆڵینەوەکەی تێناپەڕێت، پێدەچێت هەر چەند مانگێك زیادبکات و بە زوویی ڕزگاری دەبێت.

▽ بێگومان زیندان باشترە لەوەی ئینسان توشی نوقسانی یان کەمئەندامی بێت.

▽ دانپیانان مانای خیانەت نییە، وەئەو بەویستی خۆی ئیعتراف ناکات، بەڵام هەرکەسەو تواناو وزەیەکی دیاری کراوی هەیە.

ئیدی هەندێ جار لێکۆڵەر خۆی ئەم ئسلوبانە بەکاردەهێنێت، یان سود لە کەسانی بەکرێگیراو وەردەگرێت تا لەبەردەم کەسی بەندکراودا باس لەم شتانە بکەن.

▽ شێوازی قورسکردن: ئەم شێوازە پێچەوانەی شێوازی پێشترە بەڵام سەرەنجامەکەی بەهەمان ئەنجام دەگات، بۆ ئەم مەبەستە پشت دەبەستێت بە گەورەکردن و قورسکردنی ئەو تۆمەتەی ئاراستەی بەندکراو کراوە، لەگەڵ زیادکردنی چەند تۆمەتێکی تریش تا ناچار بێت دان بەهەندێ یان بە بەشێك لەو تۆمەتانە بنێت، وەبۆ

ئەوەی دواتر نکوڵی لەهەندێ لەو تۆمەتانە بکات کە بەهۆی گەورەییانەوە دەترسێت لێکۆڵینەوەی لە بارەیانەوە لەگەڵ بکرێت، وەکاتێك دان بەتۆمەتە سەرەکییەکەی خۆیدا دەنێت وادەزانێت دەسکەوتێکی گەورەی دەستخستوە کەخۆی لەو تۆمەتە زیادکراوانەی تر کە خراونەتەسەرشانی دورخستۆتەوە.

∇ بۆنمونە: تۆمەتی پلاندانانی بۆ جێبەجێکردنی چالاکییەکی جیهادی ئاڕاستەدەکات کە لە بنچینەدا تۆمەتەکەی پێدانی سەیارە بووە بەیەکێك لە جێبەجێکارانی کارەکە، یان داڵدەدانی جێبەجێکاران، وەلەوانەیە وا ت تێبگەیەنێت کە مەلەفی تەواوی لەبارەی تۆوە لەبەردەستایەو بۆ ئەومەبەستە چەند کاغەزو فایلێك لەبەردەمی خۆای دادەنێت کە گوایە چەندین تۆمەتو شایەتیدان و ئیعترافاتی تێدایە.

## شێوازی دووەم:

## شێوازی فریودان و خەڵەتاندن

بریتیە لە شێوەیەك لەو شێوازە نەگریسانەی کە بەپلەی یەکەم پشت دەبەستێت بە درۆو فێڵکردن و فریودانی بەندکراو، وەلە دیارترین شێوازەکانی فریودان:

١. شێوازی هەڕەشەکردن (تهدید):

ئەم شێوازەش لەپاش خوێندنەوەیەکی تەواو بۆ باری دەرونی بەندکراو، شارەزابون لەخاڵە لاوازەکانی دەگیرێتەبەر، بە جۆرێك بە شتانێك هەڕەشە لەبەندکراو دەکرێت کە دەبێتە مایەی دروستکردنی گوشارێکی بەهێز لەسەر دەرونی، بێگومان ئەم حاڵەتەش ڕێژەییەو لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە دەگۆڕێت، کەسی وا هەیە خاڵی لاواز تێیدا (کات و ماوەی بەندکردنە) بۆیە دوژمن هەڕەشەی لە درێژکردنەوەی ماوەکەی دەکات، کەسانی واش هەیە خاڵی لاوازیان ئەشکەنجەی جەستەیی، یان شێواندنی جەستەی، یان مەسەلەی ناموس و شەرەفە، بۆیە هەرکات لێکۆڵەر خاڵی لاوازی بەندکراوی زانی ئیدی لەو ڕێگەیەوە بەندکراو دەهەژێنێت و دەماری دەگرێت.

٢. **شێوازی فریودان:**

لێکۆڵەر پەنادەباتەبەر فریودانی بەندکراو بەوەی کە یەکێك لەگیراوەکان ئیعترافی لەسەرکردووە، بۆ جێبەجێکردنی ئەم شێوازەش چەند ڕێگایەك دەگیرێتەبەر لەوانە:

∇ **شێوازی دۆبلاژکردن و تێکەڵکردن (الدبلجە).**

بە جۆرێك یەکێك لە بەندکراوان ئامادە دەکەن، ولێکۆڵەر دەستدەکات بە پرسیارلێکردنی لەبارەی شتانێکەوە کە وەڵامەکەی بەڵی بێت، پاشان ئەم دەنگەی تۆمار دەکات و، دواتر لەبارەی جموجوڵی بەندکراوێکی ترەوە پرسیاری لێدەکات، شێوازی پرسیارەکەشی بەم جۆرە دەبێت: فلان کەس ئەوکارەی کردووە؟ دواتر وەڵامە تۆمارکراوەکانی بە (بەڵێ) لەگەڵ ڕێکدەخات و، هەتا بەم شێوەیەی لێدێت (ئایا فلان کەس ئەو کارەی کردوە؟وەڵامی تۆمارکراو بەڵێ، تۆی لەگەڵ بوو؟ بەڵێ، خۆت بینیت؟ بەڵێ) هەر بەم شێوەیە کارەکانی دۆبلاژدەکات تا بەوە قایلیبکات کە هاوەڵەکەی ئیعتیرافی لەسەر کردووە، ئەمە لەکاتێکدا گەر بەندکراوکان لە یەك ناوچە یان یەك دەستەوکۆمەڵ بن.

∇ **شێوازی سیناریۆسازی بۆ دروستکردنی دانیپیانانی (وەهمی):**

ئەم کارەش بەهاوبەشی لەگەڵ دەستەی لێکۆڵەران و بەکرێگیراوان و پاسەوانان ئەنجام دەدرێت، ئامانجیش لە ڕێکخستنی ئەم سناریۆیە قایلکردنی بەندکراوە بەوەی کە هاوەڵە بەندکراوەکەی بەهەمان تۆمەتی ئەو ئیعترافی لەسەر کردووە، وەوا تێدەگەیەنرێت کە هاوەڵەکەی گوێزراوەتەوە بۆ زیندانێکی کە، ئەمەش لە ڕێگەی بەکرێگیراوەکانەوە ئەوانەی خواردن دابەشدەکەن یان لەڕێگەی لێکۆڵەر خۆیەوە یان بەندکراوانی زیندانەکە، کە بەشێوەیەکی نهێنی پێیدەگەیەنێ کە هاوەڵەکەی گوێزراوەتەوە بۆ جێیەکی تر (بێ ئەوەی کەسی بەندکراو بزانێت دزەکردنی ئەم زانیارییە و گەیشتنی بەم بەمەبەست ڕێکخراوە)، دواتر لە پاش چەند ڕۆژێك لەڕێگەی بەکرێگیراوێکەوە لەسەر شێوەی بەندکراو هەڵدەستن بەگەیاندنی هەواڵێك بە بەندکراوەکە، بەجۆرێك بەکرێگیراوەکە لە پاش خۆپێناسادن دەڵێت بە بەندکراوەکە: ئای ئەوە تۆ فلان کەسی؟.. فلان کەسم بینی (مەبەستی هاوەڵەکەیەتی) زۆر سەلامی لێدەکردی وەلەڕوی دەرونییەوە زۆر ماندووبوو

چـونكه بەسـتـەزمانە كـەوتبووە داوی خـەڵكانێكی ناپـاك وە زۆر پەشـیمانی دەردەبـڕی چـونكە ئیعتیرافـی لەسـەر هەمووشـت كردبـوو بەڕاسـتـی لـە ڕێگـەی خـەڵكانی ناپاكـەوە هەڵخەڵەتێنرابوو، ئەو ئێستە تەواو داڕوخاوەو لە حاڵەتێكی دەرونی شكستخواردوودایە، بەردەوام دەیوت فلاَن كەس گەردم ئازادكە (یانی بەندكراوەكە) چونكە هـەموو ئیعترافێكی لەسـەر كردبوویـت... لەپاشـان لێكۆڵـەرەكان بەندكراوەكـە دێـنن و پێـی دەڵـێن هەمووشـت كۆتـای پێهـاتووەو، هاوەڵەكـەت كەوتۆتـە داوی مەدسوسـینو ئـەو ئێسـتە دانپیانانەكـەی دەنوسێتەوە، دواتر بەچاوی خۆت دەیبینیت، بەلاَم هیچ قسـەناكەیت، دەیهێنن كەسـەیری هاوەڵەكـەی بكـات كەدانیشـتووەو خـەریكی نوسـینەو، كـوپێ قـاوە یـان چـای لەبەردەمیدایـە... (هەڵبەتـە ئـەو شـتانێكی ئاسـایی دەنوسـێت كـە داوایـان لێكـردووە بینوسێت)، پاشان چاوی بەنكراوەكە دەبەسترێتەوە لە شوێنێكدا دایدەنیشێنن، پاشان لیكۆڵـەر هەڵدەسـتێت بـە بەسـتنی چـاوی هاوەڵەكـەی لـە نزیـك بەنكراوەكـە دایـدەنێتو، هەڵدەستێت بە پرسیاركردن لـەو هاوەڵـەی كـە لـە پێشچاوی هاوەڵە بەندكراوەكـەی تـری شـتـی دەنوسـی (بـێ ئـەوەی هەسـتبكات لـە هاوەڵـە بەندكراوەكـەی لـەو جێگەیـە) هەموشتەكانت نوسی؟ ئەویش دەڵێ: بەڵـێ" پرساردەكات هیچ شتێك ماوە نەتنوسیبێ؟ دەڵێـت: نـەخێـر، دیسـانەوە لێكۆڵـەر پرسـیاری لێـدەكات ئـەی لـەبارەی فـلاَن كـەس (بندكراوەكە) هەموشتت لەبارەی ئەویشەوە نوسی؟ دەڵێت: بەڵـێ، پاشان پێی دەڵێ بڕۆ پشـوی خۆت وەرگرە، وە لەڕاستیدا ئەوكەسە هیچ شتێكی نەنوسی وە ئیعترافی نـەكرد تـەنها شـتانێكی ئاسـایی نـەبێت وەئـەو بەسـەرهاتی ژیانی خـۆیی بۆ نوسیون، وەئـەوەی كـەدەیزانی لـەبارەی بەنـدكراوەوە لـە زانیـاری گشـتی ئاسـایی...، بـەلاَم بـەم ڕێگـە گومـان دەخـەنـە دڵـی بەندكراوكـەوە، بـەوەی كـە هاوەڵكـەی بەڕاسـتی داڕوخـاوە، لـەپاش ئەمـە بەندكراوەكـەی تـر دەبەنـە ژوری لێكـۆڵینـەوە وەك بڵێـی بێگومـانبون لـە ئیعتیرافكردنـی كاغەزو قەڵمی دەدەنیو قاوەیەك یان چایەكیشی بۆ دێننو، داوای لێدەكەن بە كە وردیو لەسـەخۆی هەموشـت بنوسـێت تـا ئـەویش بحەوێتـەوە وك چـۆن هاوەڵەكـەی حەوایـەوە، لەكاتێكدا گـەر ئیعترافی نـەكرد ئەشكەنجەدانی زیاتردەكەن، تـا وایتێبگەیـەنن كـە ئێسـتە ئەوان بەڕاستی لێی دڵنیابوونو چیتر نكوڵیكردن هیچ سودێی بۆێ نابێت.

∇ شێوازی بەكارهێنانی زانیاری گشتی لەبارەی موجاهیدان:

ئەمەش لەڕێگەی ئامـاژەکردن بەهەنـدێ لەزانیارییـە گشـتیەکان کەلـەلای کەسـی لێکۆڵەرپێشتر بوونی هەیە، ئیدی ئەو زانیاریانە لەڕێگەی ئیعترافاتی کەسانی ترەوە بێت، یان ڕاپۆرتی سیخوڕو بەکرێگیراوان، یان خەملاندن، یان لەئەنجامی ئاشکرایی ئوسلوب و شێوازی کاری ڕێکخراوەکەوە بێت لەشێوەی مەشق و ڕاهێنـان و سـەربازگیری و....هتد، هەرچەند ئەو زانیاریانە گشتی بن و لە چوارچێوەیەکی دیاریکراو تێنەپەڕن و شتانێکی ئاسایی بن بەڵام لەهەمان کاتدا کاریگەری لەسـەر دەرونـی بەندکراو دەبێت، تا وایلێدەکا گومانی لادروستبکات، وەهەندێ جار بخاتە حاڵەتی دڵنیاییەوە لەوەی کەلێکۆڵەر هەموو شت لە بارەیەوە دەزانێت، وەك ئەوەی لێی دەپرسێت (کەی پەیمانت بەو کۆمەڵە داوە؟ یان لێپرسراوی شانەکەت کێیە؟ یان ڕوپۆشی سەفەرکردنت بۆ فلان شوێن چی بوو؟...) هەرچـەندە ئەمانـە شـتانێکی ئاسـاین، بـەڵام کاریگـەری لەسـەر کەسـانێکی بـێ ئـەزمون دەبێت، یان بەڕاشکاوی بڵێن ئەوانەی کە بۆ پاساوێك یان نیوە پاساوێك دەگەڕێن بۆ ئیعترافکـردن، بـە بەهانـەی ئـەوەی کـە دەزگـای هـەواڵگری هـەموو زانیاریـەکانی لەبەردەستایە.

∇ شێوازی سازان و مامەڵەکردن لەگەڵ بەندکراو:

بەجۆرێك بەنـدکراو قایلـدەکرێت بـەدانپیانان بۆ لێکۆڵـەر، ئەویش لەبەرامبەر ئەوەدا کەلێکۆڵەر بێتەناو کارەکەیەوە و هەوڵبدات بۆ سووککردنی حوکمەکە لەسەری، وە هاوکاری بکات لەداڕشتنی ئیعترافەکەیدا، بەوەی کە تۆمەتەکانی هەموی ئاسانە کە گوایە بەهۆی فشـارو زۆرلێکردنـەوە بـووە لەلایـەن کەسـانی تـرەوە، وەبـەدڵنیایی بـەڵێن دەدات کـە نەگەڕێتەوە سەرکاری لەو شێوە، وەلەوەی کردویەتی پەشیمانە.

وەلێرەدا لێکۆڵەر هەوڵدەدات بەندکراو بەوە قایلبکات کە لێکۆڵەر بەلایەوە گرنگ نییە کـە بـەنکراو بۆ ماوەیـەکی زۆر یـان کـەم لـە زینـدانـدا دەمێنێتـەوە ، وە کـاری ئـەو تـەنها وەرگرتنـی ئیعترافـە بۆیـە هـەموو هـەوڵی دەخاتەگـەڕ لـە پێنـاو کـەم کردنـەوەی وادەی حوکمەکەی، وەبەوە قایلی دەکات کە ڕاپۆرتی لێکۆڵەر کاریگەریـەکی بەرچاوی هەیـە لـە حـوکمی دادوەر، وەدەزگاکـانی هـەواڵگری (مخـابرات) دەتـوانن ئـەوەی دەیانـەوێت بـۆ ماوەیەکی زۆرو بێ هـیچ تۆمـەتێکیش بیخزێننـە زیندانـەوە ، وە دەتـوانن ئـەوەی بیانـەوێ لەزیندانی دەربهێنن تەنانەت ئەگەر خاوەنی تۆمەتی گـەورەش بێت، وەلەوانەیـە پێـی بڵـێ

کەبەم نزیکانە بە هۆی دانوستانەکانەوە یان لێبوردنەوە ژمارەیەك زیندانی ئازاد دەکرێت ئەگەر بێتوو ئیعتیراف بکەیت ناوی تۆش لەگەڵیان هاوپێچ دەکەین.

## شێوازی سێیەم:

## دروستکردنی گومان ( التشكيك )

ئامانج لەم شێوازەش دوودڵکردنی بەندکراوە لەمەڕ چەند شتێك لەوانە:-

∇ دوودڵکردنی لە خودی خۆی و توانای خۆڕاگری:-

بە شێوەیەك بەندکراو واتێدەگەیەنێ کەئیعترافکردن شتێکی براوەو حەتمییەو، لێکۆڵەر هیچ پەلەی لەکارەکەی نییە، بۆیە هەڵدەستێت بەگاڵتەپێکردن و بەکەم سەیرکردنی بەندکراو، بەوەی کە سادەو ساویلکەیە لەبیرکردنەوەیداو دەیەوێت بەلەپی دەستی بەرلە سوژن بگرێت و بەپانی پەیژەهەڵگرێ وەهەروەها لە نمونەی ئەم گاڵتە جاڕی و وشانەی بە لاقرتێیەوە ئاراستە دەکات ، وە لەڕێگەی تڕەوە هەوڵدەدات هەندێ وشەی بەگوێدا بدرێ وەك (بەڕاستی کەسێکی سادەو ساویلکەیەو بۆتە قوربانی کەسانێك کە بەهەندێ بیروباوەڕی پوچ وبەتاڵ هەڵیانخەڵەتاندوە، ئەوان ئێستە لە نێومال و منداڵی خۆیاندا ڕادەبوێرن و ئەم بێچارەی بەستەزمانەش لەپێناوی ئەواندا ئەشکەنجە دەدرێت، بۆ ئەوەی دواتر پێی بوترێت کەسێکی نەبەردوو خۆڕاگرە).

وەنایەوێت ئیعتراف بکات بۆ ئەوەی پێی نەوترێ کەسێکی ترسنۆکە، وەئەمیش وەك کەسانی پێشخۆی کەلە لێکۆڵینەوەدا تاماوەیەك ئیعترافیان نەدەکرد بۆ ئەوەی بەهانەیەکیان هەبێت کەوەڵامی خەڵکی پێبدەنەوە ئەویش گوایە بەرگەی ئەشکەنجەیان نەگرتووە بویە ئیعتیرافیانکردووە.

وە ئامانج لەم ووتانەش چەند شتێکە لەوانە:

١. بەندکراو دەخاتە گومان لە نیازی کارەکەی (ئارام گری و خۆڕاگری) بەوەی (ئایا ئەم خۆڕاگرییەیە لەبەرخوایە یان بۆ ئەوەیە پێی بوترێ فلان کەس خۆڕاگرو نەبەردبوو ئیعترافی نەکرد؟!).

٢. بۆئەوەی بە جدی بیر لەوەبکاتەوە کە بەڵێ ڕاستە زۆرێك لەبەندکراوانی پێش ئەم ئیعترافیان کردوو، لەپاش چەندڕۆژێکیش لەزیندان ڕزگاریان بووەو ڕوبەڕوی لۆمەی خەڵکیش نەبونەتەوە، لێرەدا شەیتان ڕۆڵی خۆی دەبینێت و پێیدەڵێت: تۆ لەوان

خۆڕاگرتربوی گەر ئیعتراف لەسەر هەندێ شتی ئاسایی بکەی ئەوکاتە هیچ کەسیش لۆمەت ناکات....

بۆیە گەر بە ئاگا نەبێت دەستدەکات بەبیرکردنەوەلەوەی کە ئیعتراف بە بەشێکی کەم و تەنها لەسەر خۆی بکات .....، تا لەکۆتایدا بە ئیعترافی گشتی و لەسەر هەموو ئەوانەی دەیانناسیێ و، دیان زانیێ ، یان پێشبینی کردبێت کۆتای دێت، ئەمە ئەگەر بەیەکجاری خۆی نەدۆڕێنێ !!.

∇ دوودڵکردنی لەمەڕ هاوڕێیانی:

ئەمەش بەدووپات کردنەوەی هەندی دەستەواژەو هێنانەوەی پەندو قسەی باو بۆی وەك (کەسانێك دەیخۆن مریشکی برژاو، ئەوانی دی دەکەونە داو)، وە بەوە ڕوبەڕوی بەندکراو دەبنەوە کە تێوەگلاوە چۆن تێوەگلانێك، وەبۆتە قوربانی کەسانێکی هەلپەرستو ماڵ پەرست تا گەیاندیانە بەندینخانە، ئەوان ئیستە لە ماڵ و حاڵی خۆیانن و ئەویش لێرە ئەشکەنجە دەدرێت، وەهەوڵدەدەن لەوە دڵنیای بکەن کە ئەگەر بەر پرسەکەی لە جێی ئەو بوایەو ڕووبەڕوی ئەو ئەشکەنجانە بوایەتەوە بەدڵنیایی ئیعترافی دەکرد چ جای ئەوەی هەوڵی قایلکردنی بەن !!!.

وەهەوڵدەدەن کە قایلی بکەن کە ئەوانەی ئەو کاری لەگەڵ کردوون دزەیان کراوەتەوناو، وەئەویش کە ئێستە لە زیندانە لەسەر ئەو زانیاریانەیە کە لەڕێگەی ئەوانەوە دزەیانکردووە کە کاری لەگەڵ کردوون !!!.

∇ دوودڵکردن لەمەڕ بەرپرس وسەرکردەکانی:

ئەمەش لەڕێگەی باسکردنی خۆشگوزەرانی و رابواردنی سەرکردەکانی، بەجۆریك کەئەوان هیچ کۆششێکیان نەبووە هیچ قوربانیەکیان نەداوەو، ئەوان وەك مەلیکی شەترەنجن و ئەمیش وەك جوندی تەنها بۆ پاریزگاری لەمەلیك و قوربانیدان لە پێناویدا بەکاردەهێنراوە، وەهەوڵدەدەن بەدگومانی بکەن لە ناموس و و پاکێتی سەرکردەکان، کە گوایە ئەمان ئاگاداری دزینی ماڵو پارەی ئەوانن کە بۆ بەرژەوەندی تایبەت و گەیشتنە پلە و پۆست بەکاری دێنن، وەهەوڵ دەدەن هەندێ بیرۆکە لە مێشکدا بچێنن لەوانە: (تۆ بۆ خۆت بیر بکەرەوە، مەیەڵە کەسانی تر بیرت بۆ بکەنەوە) وەتۆ ئێستە لە ژێر ئەشکەنجەدای

ئەگەری مردنت یان تێکچونت زۆرەو، منداڵەکانت سبەی هەتیو دەکەون، وەبەچاوی خۆت زۆرێك لەخێزان و منداڵی شەهیدان دەبینی کەچۆن ژیان بەسەردەبەن و دەست لەخەڵکی پان دەکەنەوە؟ لە هەمانکاتدا بەرپرسان هەرچی هەیە لە کۆشك و سەیارەو گەشت و گوزاردا سەرفی دەکەن !!!.

∇ دوو دڵکردنی لەمەڕ دین و بەها پیرۆزەکان و ڕەوایی ئەو کێشەیەیی کەئەو جیهادی لەپێناودا کردووە:

ئەمەش لەڕێگەی گفتوگۆی هێمنانەی لەگەڵ بەندکراو سەبارەت بەو بۆچون و بیردۆزانەی دوژمنانی ئیسلام بانگەشەی بۆ دەکەن بەتایبەت (جیهانگەرایی و عەلمانیەت و دیموکراتی و لیبراڵی بون...) ئەم ئوسلوبەش زیاتر لەگەڵ کەسانێك بەکاردەهێنن کەئاستی ڕۆشنبیریان لاوازبیٚ و، بەڵگەی بەهێزو دەمکوتکەریان لەسەر ڕەوایی کێشەکەیان پێنەبیٚ، وەتوانای موناقەشەکردن و ڕوبەڕوبونەوەیان نەبێت، مەبەستیان لەم کارەش چاندنی تۆوی گومان و دودڵییە لەمەنهەج و بیروباوەڕیاندا.

∇ دوودڵکردنی لەمەڕ سوود بەخشی کارو هەوڵەکان:

لەو ڕوانگەوە لێکۆڵەر دەستدەکات بەگفتوگۆ لەگەڵ بەندکراو، خۆزگە دەبیٚ بەردوو دەمانچەو کلاشینکۆف و تەقاندنەوەی کەسێك یان سەیارەیەك چ سودێکی هەبێت لە بەرامبەر لەشکری بیٚ شومارو ئەو هەموو تەکنەلۆژیا و چەکە پێشکەوتوو ئامێرە نوێیانەدا، لەکاتێکدا لەشکرو هێزی وڵاتە عەرەبیەکان ناوێرن ڕوبەڕوی ببنەوە چونکە ئەوان ئەندازەو توانای بەرامبەرەکەیان دەزانن، ئیدی گروپ و ڕێکخراوێك بەتەنها و دابڕاو لە خەڵك و جیهان چۆن دەتوانێت ئەو جەنگە بەرپا بکات و ڕوبەڕوی ئەو هێزە زەبەلاحە جیهانیە بێتەوە، وەئەوەشی (موجاهیدان) پێی هەڵدەستن بیٚ سودەو تەنها کارێکی خۆکوژییەو لەپشتەوە خەڵکانێکی هەلپەرست و بەرژەوەندی خواز هانیاندەدەن و، ئەوانەشی هەڵدەستن بەئەنجامدانی کارەکان خەڵکانێکن بونەتە قوربانی سۆزو عاتیفەی هەڵچویان.

## شێوازی چوارەم:
## ملـپێکەچکردن و خۆ سە پیاندن

ئـەوەش بەچاوشـۆڕکردن و ملپێکەچـکردنی بەنـدکراوە بـۆ ویسـتی لێکۆڵـەر، لـەپاش قـایلکردنی لـەوەی کـە لێکۆڵـەر کەسـایەتییەکی بـەهێزەو توانـای ئەشـکەنجەدان و زەلیلکردنـی هەیـەو، زانیـاری زۆری لـە بـارەی بەنـدکراو لەلایـە، وە خـاوەنی ئـەزمون و شارەزاییەکی بالأیە...

لە شێوازەکانی مل پێکەچکردن و خۆسەپاندن:

▽ دابڕینی کەسەکە لە ڕوی کۆمەلأیەتییەوە:

ئەمـەش بـە دوور خسـتنەوەی لەسـەرجەم بوارەکـانی ژیـانی کۆمەلأیـەتی و ڕێگـری لـە هـەموو جـۆرە پەیوەندییـەك، تـەنها پەیوەندییـەك نـەبێت کـە دوژمـن لەبەرژەوەنـدی خـۆی ڕێگـەی پێبـدات، وە کاریگـەری خراپـی لەسـەر دەرونـی بەنـدکراو دروسـتبکات، وە ئەنجامەکەشـی سـود بەلێکۆڵـەر بگەیـەنێت و، ببێتـە مایـەی زیـاتر لاوازکردنـی بەنـدکراو لەبەردەم لێکۆڵەردا.

▽ خستنەڕوی تواناو دەسکەوتەکان:

لێکۆڵـەر بـەردەوام بـاس لـەتواناو هێـزو دەسـتکەوتەکانی دەزگـا ئەمنیەکـەی دەکـات و لەگەڵ بەراوردکردنی بەهێزو تواناکانی ئەو دووژمنەیان کە بەندکراو لایـەنگیریان دەکات، ئەمەش بۆ ئەوەی بەندکراو زیاتر هەست بە بێدەسەلأتی و لاوازی خۆی بکات.

▽ چاوشۆڕکردن و زەبونکردنی بەندکراو بە تفتێکردن و جنێو پێدانی:

ئاشـکرایە کـە جنێـودان و تفتێکـردن یەکێکـە لـە هۆکارەکـانی زەلیلکـردن وەدووبـارە کردنەوەشـی دەبێتـە مایـەی هەسـتکردنی زیـاتری بەنـدکراو بـە زەبونی و چاوشـۆڕی، وە هـەروەها بـانگکردنی بـەناوی ئـاژەڵ و حـەیوانات، لەگـەڵ لاقرتـی پێکـردن و ناوهێنـانی بـە ناوی کەسانی سوك و ڕیسواوە بەمەبەستی زیـاتر نـابودکردنی و پەستکردنی، وەدورنییە کـە پۆشـاکی نەشـیاو قێزەونـی لەبەربکـەن و ، چـەند لێکۆڵـەرێك بێنـە تەماشـای و کـە لـە

نێویشیاندا ئافرەت هەبێ بەمەبەستی لاقرتی و گاڵتەکردن و کاتبەسەربردن، وە یان داوای لێدەکەن کە جنێو بەخۆی یان خزمانی یان پیرۆزیەکان و بیروباوەڕی خۆی بدات.

∇ گێڕانەوەی هەست و نەستی بەنکراو:

وەك داوای لێبـوردن لێکردنـی و، ڕێزلێگرتنـی لـەپاش سـوکایەتی پێکـردن، وەنـەرمو نیانی نواندن و داڵدەدان پاش ئەشکەنجەدان و توندو تیژی، وەبەپێچەوانەوە سوکایەتی پێکردنی پاش ڕێزلێگرتن، بۆ نمونە، لێکۆڵەر لەگەڵ بەندکراو دادەنیشێت و وەك دۆستێك مامەڵـەی لەگەڵـدەکات لـە پـڕ تـف دەکاتـە ناوچـاوی و بـە لێـدان دەکەوێتـە وێزەیـی و بەناشیرینترین و قێزەونترین ناتۆرە ناوی دەبات، ئەمەش بە ئامانجی روخاندنی دەرونی بەندکراوەکە.

∇ شێوازی هەژاندن و دەمارگرتن (الابتزاز):

وەك هەڕەشەکردن بە دەستدرێژی جنسی و ئابڕوبردنی، یان هێنانی خێزان و خوشکی بۆ جێگەی بەندکردنی، یان بە هەڕەشە کردنە سەر بەرژەوەندییە شەخسییەکانی وەك: سوتاندنی مەحەل و کارگەو دووکانی،یان ڕێگری کردنی لە خوێندن و سەفەرکردنی،یان.. هتد.

∇ شێوازی ناچارکردن و خەجاڵەتکردن (احراج):

وەك ڕوبـەڕوو کردنـەوەی چـەند پرسـیارێکی هەسـتیارو پەیوەندیـدار بـە ناموسـوو شـەرەفی بەنـدکراو بـە شـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ وەك: خوشـکەکەت جوانـە؟ مۆڵـەتمان پـێ ئـەدەیت کـە...؟ یـان پرسـیار لێکردنـی لەمـەڕ کـارە زۆر قێزەونـەکان، وەك بڵێـت: تـۆ کـاری وات کردووە؟ کاری وائەکەیت یان نا؟ کاری وات لەگەڵ کراوە؟.

∇ شێوازی خۆسەپێنی و کۆنترۆڵکردن:

بە جۆرێك بەبێ مۆڵەتی لێکۆڵەر ڕێ بە بەندکراو نادرێ هیچ کارێك بکات، وەهەر ئەو بۆی دیاریدەکات کە کەی بخوات، کەی بخواتەوە، کەی قسە بکات، کەی بخەوێت، کەی بچێتە سەرئاو.

∇ دووپاتکردنەوەی تۆمەتەکان:

لێکۆڵەر جار لەدوای جار دووپاتی دەکاتەوە بۆ بەندکراو کە تاوان بارە، وەپێشی ڕادەگەیەنێت کە ئەوکارەی پێی هەڵساوە تاوانێکە هیچ دینو یاساو ژیرییەکی ساغ پێی ڕازی نییە، وەئەو تەنها ئامانجی کوشتنی خەڵکانی بێ تاوانە، لە گەڵ دوبارەکردنەوەی بەردەوامی ئەو دروشمانەی کە پێچەوانەی بیرو باوەڕی بەندکراون.

## شێوازی پێنجەم:
## پەرتکردن و شێواندنی بیرو هۆش ( تشتيت الافكار )

شێواندن و پەرت کردنی بیرو هۆشی بەندکراو بەیەکێك لەم شێوازانەی خوارەوە:

∇ قاڵکردنی بیرو هۆشی بەندکراو بە چەند بابەتێکی جیاواز لەیەك کاتدا:

ئەوەش بە ئاراستەکردنی چەند تۆمەتێك لە یەککاتدا، تا بیر لەوە بکاتەوە چۆن بەرپەچی هەموو ئەو تۆمەتانە بداتەوە یان بە هانەیان بۆ بێنێتەوە، یان چەند چارەسەرێکی دەخرێتە بەردەست تا بیریان لێبکاتەوەو شایستەترین و شیاوترینیان هەڵبژێرێ، ئەمەش بە ئامانجی نەمانی تەرکیزو پەرتکردنی بیرو هۆشی بەنکراو، لە کاتێکدا کەبەندکراو هەر لە سەرەتاوە بەهۆی بیرکردنەوەی لە خێزان و دایك و منداڵ و چەند چەند بابەتێکی لاوەکی ترەوە بەشێکی زۆر لە تەرکیزی لەدەستدەدات.

وەدیسانەوە لێرەدا لێکۆڵەر بۆ گەیشتنە ئامانجەکەی پەنادەباتە بەر قۆستنەوەی لایەنی سۆزو عەتفی بەندکراوو بایەخێکی گرنگی پێدەدا.

∇ دوو دڵکردن و بێزارکردنی بەندکراو:

بەجۆرێك بۆ ماوەیەکی زۆر پشتگوێ دەخرێت و لە زینداندا دەهێڵرێتەوە بێ ئەوەی هیچ تۆمەتێکی ئاراستە بکرێت، ئەمەش بەمەبەستی سەرفکردنی حەوسەڵەو ووزەی لە گەڕان بە دوای هۆکاری دەسگیرکردنی و ئەگەری ئەو تۆمەتانەی ئاڕاستەی دەکرێت.

∇ ئاراستەکردنی زیاد لەپرسیارێك لەیەك کاتداو لەلایەن چەند لێکۆڵەرەوە، ئەم شێوازەش کاردەکاتە سەر ئاستی بیرکردنەوەی بەندکراوو تەرکیزی لاوازدەکات.

## شێوازی شەشەم:
## شێوازی پەنابردنە بەر ئامێری ئاشکراکردنی درۆ

ئویش بریتییە لە بەکارهێنانی ئامێرێك بۆ پێوانی لێدانی دڵو گەرمی لەشو فشاری خوێن، بە جۆرێك جوڵە خۆنەویستییەکانی جەستەو، کاریگەری و پەرچەکردارە سۆزییەکان (رد الفعل العاطفی) لە ئینساندا دەپێوێت.

ئەم کارەش بەمەبەستی فشار خستنە سەرو گەورەکردنی تۆمەتی بەندکراوو جەنگێکی دەرونی لە دژی ئەنجام دەدرێت، وە دەکرێت کاری ئەو ئامێرانە پوچەڵ بکرێتەوە ئەویش لەرێگەی هەڵچونی دروستکراو لەکاتی پرسیارە ئاساییەکانداو هێوری و لەسەخۆبوون لە کاتی پرسیارە دژوارەکاندا، ماسولەکەکانی سکت یان قاچەکانت بگوشەو خۆت گرژکە، بەمەبەستی زیاد بوونی نائارامی حاڵەتی دەماغ (ئەعصاب) ئەمەش لەکاتی باسکردنی بابەتە ئاساییەکاندا تا بۆ بەرامبەری بسەلمێنێت کە پێوانەی ئامێرەکە کاراو دروست نییە، بەوشێوەی ئەوان دەیانەوێ نیشانی بدەن.

## شێوازی حەوتەم:

## شێوازی دەمارگرتن ( الاعصاب )

ئـەم شـێوازە پشـت دەبەسـتێت بـە مانـدوكردنی دەمارەكـانی مێشـكی بەنـدكراوو لەدەستدانی پارسەنگی و نەمانی توانای زاڵبون بەسەر مێشك و ئەعصابی خۆیدا، ئەمەش بەگرتنەبەری هەمو ئەو ڕێیانەی كاردەكەنە سەر مێشـك و مانـدوی دەكـەن، ئامانجیش لـەم كارە بۆ گەیاندنی ئەو كەسە یە بە ئەو پەڕی پلەی ماندوبونی مێشك و داڕمانی دەرونی بە جۆرێكی وا هەر ئاڕاستەیەك لەلایەن لێكۆڵەرەوە بێت پێی قایل بێت و ڕەدی نەكاتەوە.

لە نمونەی ئەو هۆكارانەی بەكار دەهێنرێن بۆ فشار خستنە سەر دەمارەكانی مێشك:

∇ قەدەغەكردنی لەخەو بۆ ماوەیەكی درێژخایەن.

∇ بێزاركردنی بە دەنگە بەرزەكان بەبەردەوامی تا تەركیزی نەمێنێت.

∇ قەدەغەكردنی لە خواردن و خواردنەوە.

∇ دانانی لەبارێكی قورس و سەختدا وەك: (سەرمایەكی سەخت، گەرمایەكی زۆر).

∇ كۆتكردن بۆ ماوەیەكی زۆر بە شێوەیەكی سەخت و ناشایستە و نەشیاو.

∇ داوای ئەنجامدانی هەندێ ڕاهێنانی قورس و گران.

∇ وەستاندن بۆ ماوەیەكی زۆر.

∇ دووپاتكردنەوەی پرسیارەكان بە جۆرێكی بێزاركەرو دەمار هەژێن.

∇ ڕژاندنی ئاوی سارد بە سەریدا.

∇ دانانی لەشوێنێكی بۆگەن و قێزەون و نەشیاودا.

∇ دانانی لە شوێنێكی تەنگا.

∇ سەركردنی بە ئاوداو دەرهێنانەوەی و دووپاتكردنەوەی ئەم كارە.

∇ چاوبەستن و تورەكە لە سەركردن.

∇ دروستکردنی حاڵەتی لەناکاوو کوتوپر بۆ بەندکراو. وەك ئەوەی لە پڕ ببینێت یەکێك لە ئەندامانی گروپەکەی یان خێزانەکەیان هێناوەتە زیندانەکەی.

## شێوازی هەشتەم:
## شێوازی هۆکارە جەستەییەکان.

ئەویش بە:

∇ لێدانی سەرو قوڕگو ناوسك.

∇ فشار خستنە سەر جومگەکان (ئەژنۆکانو مەچەکەکانو بڕبڕەی پشت).

∇ گوشینی هێلکە گونەکان.

∇ هەڵکەندنی موی سەرو ڕیشو سنگو بەر.

∇ گوشار خستنە سەر قوڕگو هەناسە لێبڕین.

∇ لێدانی سمتو پشتو ژێر پێیکان بە کێبڵ.

∇ هەندێ جار بەکارهێنانی وزەی کارەبا و جگەرە.

∇ هەڵواسین بۆ ماوەیەکی زۆرو خولاندنەوەی بە پانکەوە.

∇ دەرهێنانی نینۆکەکانی دەست و پێ.

# بەشی چوارەم:
# چۆنێتی ڕووبەڕو بونەوی شێوازەکانی لێکۆڵینەوە

بەر لەهەموشت پێویستە ئامانجمان لە ڕوبەڕوبونەوەی لێکۆڵینەوە، ئیعترافنەکردن نەبێت، بەڵکو قایلکردنی لێکۆڵەرو دەزگا ئەمنیەکان بێت بەوەی کە سەرجەم ئەو زانیاریانەی لەبەردەستیاندایە هەڵەو نادروستن، وە کەسی بەندکراو هیچ جۆرە جموجولێو چالاکیەکی نییە کە پێی تۆمەتبار بکرێت، وەخستنە گومانو دوودڵکردنیان لەسەرچاوەکانی زانیاریان، بێگومان ئەمەش کارێکی گەورەو جیهادێکی پیرۆزە کە بەندکراو بەهاوشانی برایانی دیکەی پێی هەڵدەستێتو، بەم کارەشی لێکۆڵەر دەخاتە حاڵەتی بەرگریکردن لە زانیاریەکانو سەرچاوەی وەرگرتنیان.

لەو خاڵە گرنگانەی کە پێویستە بەندکراو لە کاتی لێکۆڵینەودا ڕەچاویان بکات:

**یەکەم: هێنانەوە یادی مانا ئیمانیەکان، لەوانە:**

- هێنانەوەیادی ماناکانی (الابتلاء والمحن) تاقیکردنەوەو ناهەمواریەکانی ڕێگای خواویستی، وەك مانای: (أن ما اصابك لم يكن ليخطئك) ئەوەی توشت دێت بێگومان بەهەڵە نەبووە بە ڵکە بەویستی خوای تەعالا بووە.
- داوای کۆمەك لە پەروەردگارو، پەنا بۆ بردنی بە نزاو پارانەوە بەو دووعایانەی لە قورئانو سوننەتدا هاتوون، وەك: (اللهم اني استودعك نفسي و المعلومات التي اعرفها) واتە: پەروەردگارم من خۆم و ئەو زانیاریانەی دەیزانم سپاردەی تۆدەکەم.
- وەبیرخۆهێنانەوەی نیازپاکیو مەبەستی بۆخوابون، وەبە ئامانجکردنی ڕەزامەندی خواو شادبون بەبەهەشتەکەی، ئیدی لەوکاتانەدا هەموو قوربانییەك لەو پێناوەدا ئاسان دەبێت.
- هێنانەوەیادی واتاکانی (خۆنەویستیو قوربانیدانو شەهادەتخوازیو دورکەوتنەوە لەخۆپەسەندی...)



∇ هێنانەوەیادی ئامۆژگاری سەروەرمان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم بۆ عبدالله ی کوڕی عباس کە پێی دەفەرموو: (يا غلام إني إعلمك كلمات احفظ الله يحفظك، إحفظ الله تجده أمامك، إذا سألت فاسال الله واذا استعنت فاستعن بالله، واعلم أن الامة لوا اجتمعت على أن ينفعوك لم ينفعوك إلا بشيء قد كتبه الله لك، ولو اجتمعوا على أن يضروك لم يضروك إلا بشيء قد كتبه الله عليك رفعت الأقلام و جفت الصحف).

واتە: ئەی لاوەکە چەند ووتەیەکت فێرکەم: (سنوری خوا بپارێزە دەتپارێزێت، فەرمانەکانی بپارێزە دەبینیت لەپێش چاوتە، گەر داواتکرد تەنها لەو داوا بکە، وە ئەگەر داوای پەناو کۆمەکت کرد ئەوە پەناب بەو بگرە، وە بزانە گەر سەرجەمی گەلان کۆببنەوە بۆ ئەوەی سودێکت پێبگەیەنن ناتوانن گەر خوا بۆی نەنوسیبیت، وەگەر هەموان کۆببنەوە بۆئەوەی زیانێکت پێبگەیەنن ناتوانن گەر خوا لەسەری نەنوسیبیت، پێنوسەکان هەڵگیراون و مەرەکەبەکەش وشك بۆتەوە).

دووەم: وەبیرخۆهێنانەوەی ماناکانی خۆڕاگری و نەبەردی.

∇ سود وەرگرتن لەکاتەکەو قۆستنەوەی بۆ وەبیرخۆهێنانەوەی نەفەسدرێژی و گرنگی خۆڕاگرتن، هەرگیز بیر لەشتانێك مەکەوە کەکاری گەری خراپ لەسەر ورەو باری دەرونیت بکات.

∇ بیر لەو متمانەیە بکەرەوە کە هاوەڵان و ڕێکخراوەکەت پێیان کردوویت.

∇ دڵنیابە کە خۆڕاگری لەئادەمیزاددا ویست و ئیرادەیە، وە ئادەمیزاد توانایەکی گەورەی هەیە لە خۆڕاگرتن و ڕوبەڕوبونەوەی ئازارەکان و جۆشبون و ڕاهاتن لەگەڵیاندا، ئەگەر نیەت و ئیرادەی هەبێت.

∇ هێنانەوەیادی نمونەی ئەستێرە بەرزەکانی ئاسمانی خۆڕاگری و نەبەردی لە پێغەمبەران و هاوەڵان و پێشەوایانی بانگەواز وجیهاد لەمێژوی دوورونزیکی ئیسلامیدا وەك: (بیلال و عەممار و احمدی کوڕی حنبل و ئیبن تەیمیەو سەید قوتب و.....)

∇ وە بیرخۆهێنانـەوەی دوژمنایـەتی شەخسـی لـەنێوان تـۆو لێكۆڵـەردا كـە بەهـەموو چەشـنو شـێوازێك ئەشـكەنجەو ئـازارت دەداتو هـەوڵی زەلیلكـردنو سـوكایەتی پێكردنت دەدات، ئیدی لە بەرامبەردا تۆ چۆن ئیعترافی بۆ دەكەیت.

سێیەم: بیركردنەوە لەئاكامو دەرەنجامەكان:

∇ لە یادت نەچێت كە لێكۆڵینەوە جەنگێكە ئاكامەكەی یان سەر بڵندیو سەركەوتنە یان شكستو دۆڕانو سەر شۆڕییە لە بەرامبەر دووژمنەكەت.

∇ بیر لەهەڵوێستـی خۆتبكـەرەوە كـە لـەپاش ئیعترافكـردن كاتێـك كـەداوای شـایەتیت لێدەكەن لەسـەر هـاوڕێو براكانـت، وە بیر لـەو هەڵوێسـتەت بكـەرەوە كە بەهۆی تـۆوە توشـی چ ئەشـكەنجەو ئازارێـك دەبـن لـە (گـرتنو ڕاوەدونـانو شـەهیدی....)، وە بـیر لەهەڵویسـتت بكـەرەوە لەبـەردەم خێـزانو بەنەماڵەكانیانـدا، وە لەبـەردەم بنەماڵەكـەی خۆتا.

چوارەم: فریونەخواردن بە شێوازەكانی لێكۆڵینەوەو لێكۆڵەران:

∇ پێویستە ئەو ڕاستیە بزانیت كـە مـەرج نییـە لێكۆڵینـەوە بـە هـۆی تۆمـەتێكی چەسپاو یان بەهۆی بونی زانیاری ڕاستو دروستەوە بێت لای دوژمن.

∇ پێویستە باری ئاسایی دەرونو پارسەنگی خۆت ڕاگریـتو، نەخشـەو پلانـی شیاو بۆ گەمـەكردن بـە مێشـكی لێكۆڵـەر دارێـژیت، بـۆ ئـەوەی بتوانی هەسـتی لێكۆڵـەرو حاڵی دەرونی بۆ بەرژەوەندی خۆت بقۆسیتەوە.

∇ مامەڵـەی خراپـی دوژمـنو نوانـدنی دڵڕەقـی وەك نمـایشو كاردانەوەیـەكی ئاسـایی تەماشا بكە كەئەویش تەنها لە پێناوی دەستخستنی زانیاریو ئیعتیرافكردنە.

∇ بیرنەكردنەوە لەو بیردۆزەی كە دەڵێت: (دانپیانان = ڕزگاربون لە ئەشكەنجە).

∇ بیر لـەوە مەكـەرەوە كـە دوژمنـان لـەپێناوی زانیاریـدا ئەشـكەنجەت دەدەن بەڵكـە ئـەوە بەبیری خـۆت بێنـەرەوە كە ئەمە تاقیكردنەوەیـەكی خواییە، وەئـازاری بـێ بـاوەڕان بـۆ

ئيمان داران بەهۆی ڕق و كينەيانەو، لە پێناوی سازشكردنيانە لە بيروباوەڕەكەيان يان پيرۆزيەكان يان شەرەف وناموسيان.

∇ لەبيرتبێ كە لێكۆڵەر كەسێكی ئاساييە و سنوری توانای ديار كراوەو، ئەهلی كەرامەت نييەوغەيب و پەنهان نازانێت، وەدڵنيابە كە، سەركەوتن ئارامگری ساتێكە (النصر صبر الساعه).

∇ بيرنەكردنەوە لە خێزان و منداڵ و كەس و هاوڕێيانت، وەهەروەها و كار و گرفتەكانی ڕێكخراوەكەت.

∇ كەلێكۆڵەر بە كەسێكی درۆزن بزانە، درۆزنە لەهەموو ئەو بەڵێنانەی دەيدات، لە هەموو ئەو هەڕەشانەی دەيكات، جا ئيتر بە شێوازی دۆستانەبێت يان دوژمنانە.

∇ بەئاگابوون لە شێوازی ڕاكێشان و هەژاندنی لێكۆڵەرو، لاوازی نەنواندن لەبەرامبەر هەڵويستی، ئارەزوو خستنەبەرو كارئاسانيەكانی.

∇ واگومان مەبە كەتۆ لەژێر دەستەلاتی ئەواندا.

∇ لاوازی مەنوێنە لەبەرامبەر هەڕەشكردن بە ناوزڕاندن يان بە ئاگاداربون لەهەندێ كەلێن و كەموكورتی لەتۆدا.

∇ لە كاتی هێنانی خوشكت يان خێزانت بزانە گەر بيانەوێت كارێك بكەن كە تۆ پێت ناخۆشەو ئەزيەتی دەرونت دەدا، ئەوە دڵنيابە كەس ناتوانێت ڕێگرييان بكات لەو كارە تەنها خوا نەبێت، وەبزانە جێبەجێكردنی داواكانيان يان ئيعتراف كردنت نەدەبێتە هۆی ئەنجامدانی نەدەبێتە هۆی ڕێگری لەو ويستەيان، لێرەدا ئێمە ناڵێين ئەو كاتە چی دەكەی، بەڵام چەند پرسيارێكت لێدەكەين تۆ خۆت وەڵامبدەرەوە ئەو كات بەويستی پەروەردگار خۆت دەگەيتە ڕێگە چارە.

پرسیاری یەکەم: لە کاتێکدا ئەگەر نیازی دەستدرێژی یان هەبێت بۆ سەر شەرەف و ناموست، وە یاساکانیان ڕێگەی ئەوەیان پێبدات، چ زەمانێك هەیە لەپاش ئەوەی ئیعترافتکرد ئەو کارە ئەنجامنەدەن ؟!.

ئەمە لەکاتێکدا کە تۆ متمانەت بە بەڵێنەکانیان نیە، وەلەوە دڵنیانیت کەبە داواکردنی زانیاریەکان وازت لێبێنن‌و داوای شتانی تر یان کاری ترت لێنەکەن، ئیدی چۆن‌و لەسەر چ بنەمایەك زانیاریان دەدەیتێ‌و مل بۆ داواکانیان کەچ دەکەیت.

پرسیاری دووەم: ئایا دڵنیایت لەپاش ئیعترافکردنت داوای ئەوەت لێناکەن وەك هەواڵگرێ کاریان لەگەڵ بکەیت؟ هەڵبەتە کاتێك ڕەدیدەکەیتەوە دەگەڕێنەوە بۆ هەمان شێوازی هەڕەشەکردن بەو خاڵە لاوازە کە شەرەف و ناموسە ئەوکات دەبێ چی بکەیت؟!! وەخۆت دەزانیت ئاکامی ئەوکەسە چۆنەو چییە کە قایل دەبێ بە هاوکاریکردن لەگەڵ دەزگاکانی هەواڵگری (المخابرات) کەچیتر هیچ ئەرزشێك بۆ دین‌و ناموس‌وشەرەف‌و خاك دانانێت.

ئەگەر داخوازیەکەیان بۆ کارکردن لەگەڵیان ڕەددەکەیتەوە، وەڕازی نابیت ببیتە بەکرێگیراویان، هەرچەندە بەو هۆیەوە ڕوبەڕوی هەموو نارەحەتیەکیش ببمەوە. ئەی بۆچی هەر لەسەرەتاوە ئەمە هەڵوێستت نەنواند !!؟.

پرسیاری سێیەم: ئەی هەڵوێستت چۆن‌و چی دەبێت لەکاتێکدا هەڕەشیان لێکردیت بەدەستدرێژکردنە سەر ناموست بۆ ئەوەی هەندێ زانیاریان پێبڵێت کەلەبنچینەدا تۆ هەر ناشیانزانیت؟!!.

گەر دەڵێت: درۆیان لەگەڵ دەکەم‌و، زانیاری هەڵەو نا دروستیان پێدەدەم، کەوابوو بۆچی هەر لەسەرەتادا هەمان ڕێگا بەکارناهێنیت لەمەڕ ئەو زانیاریانەی دەیانزانیت‌و ئەوان دەیانەوێ؟!!

### بۆ زانیاریت:

هەندێ جار کاری سیناریۆ ڕێك دەخرێت بە مەبەستی فریودانی بەندکراو، بۆ نمونە: خێزان یان خوشکی بەندکراو لەپاش ئامادەکردنیان دەخرێنە ژورێك‌و لەلایەن هەندێ

ئافرەتەوە دەسدەکرێت بە ئشکەنجەدانیان لەکاتێدا کە هاوارو قیژەیان بەرز دە بێتە ئیدی بەنکراو وادەزانێت دەسدرێژیان کراوەتەسەر.

## پێنجەم: خۆپارێزیو وریایی بەردەوام:

- ∇ متمانەت بە هیچ یەکێك لەوانە نەبێت کە لەنێو زیندا دەیانبینیت، چونکە دڵنیابە بەکرێگرتەو سیخوڕیان لەنێودایە ئەگەر لەڕواڵەتیشدا خۆیان بە موجاهید نیشانبدەن.
- ∇ لە نێو زینداندا هیچ جۆرە چالاکیەك ئەنجام مەدە کە ببێتەمایەی سەلماندنی تۆمەت لەسەرت.
- ∇ بیرنەکردنەوە لەئیعترافکردن، ئەگەر لەسەر بەشێکی بچوکیش بێت لەکاتێکدا تۆ لەدۆخێکی دەرونی داڕوخاودایت.
- ∇ ئەگەر بەنیازبویت بەپێی پلانێکی تۆکمەو بەرنامە بۆ داڕێژراوی پێشوەخت ئیعترافبکەیت، با لەکاتێکدا بێت کە تۆ لەئەوپەڕی هێزی جەستەیو دەرونیو بیرسافیدا بیت، مەبەستیشمان لەپلانی ئیعترافکردن ئەوەیە کە هەستیت بەروپۆشکردنی کارەکانت لەڕێگەی ئەو چیرۆکە دروستکراوە (وەهمی)یەیی کە دەیگێڕیتەوە،ئەویش لەکاتی دەستگیرکردنت بە شتانێکی گوماناوییەوە، وە بە مەبەستی شاردنەوەی کەسانی هاوکارو ئەو زانیاریە گرنگانەی لەلایەتە.

تێبینی: پێویستە بەئەوپەڕی ڕێکوپێکی ئەو دەورەی پێی هەڵدەستیت ئەنجامی بدەیت، بۆیە ئەگەر لەبەردەم لێکۆڵەردا خۆت بەکەسێکی متمانەبەخۆو ئەستوپاك نیشان دەدەی پێویستە بەهیچ شێوەیەك دڵەراوکێیو نیشانەکانی لەرزۆکیت پێوە بەدی نەکرێت، لەوانە:-

- ∇ ئارەقکردن.
- ∇ لەرزۆکیو تەتەڵەکردنی زمان.

∇ چاوگێڕان و هەوڵدان بۆ خۆدزینەوە لەنیگای لێکۆڵەر.

∇ دووبارەکردنەوەی وەڵامەکان بە: لەوانەیە، بیرم نی یە.. وەهەروەها.

اللهم لولا أنت ما اهتدينا و لاتصدقنا و لاصلينا

فأنزلن سكينة علـــــينا و ثبت الأقدام إن لاقينا

إن الأولى قد بغوا علـينا إذا أرادو فتنة أبيـــــنا

**وصلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى اله وصحبه وسلم**

**والحمدلله رب العالمين**

# پێڕست

پێشدەست.....................................................................................
لێکۆڵینەوە.................................................................................
پێناسەی لێکۆڵینەوە.......................................................................
بەشی یەکەم : هۆکانی لێکۆڵینەوە (أسباب التحقیق)..................................
بەشی دووەم: قۆناغەکانی لێکۆڵینەوە.........................................................
بەشی سێیەم: شێوازەکانی لێکۆڵینەوە..........................................................
شێوازی یەکەم: شێوازە دەرونیەکان............................................................
شێوازی دووەم: شێوازی فریودان و خەڵەتاند.................................................
شێوازی سێیەم:دروستکردنی گومان (التشکیك) ........................................
شێوازی چوارەم: ملپێکەچکردن و خۆ سەپیاندن ......................................
شێوازی پێنجەم: پەرتکردن و شێواندنی بیرو هۆش (تشتیت الافکار) ....................
شێوازی شەشەم: شێوازی پەنابردنە بەر ئامێری ئاشکراکردنی درۆ...................
شێوازی حەوتەم:شێوازی دەمارگرتن (الاعصاب) .........................................
شێوازی هەشتەم: شێوازی هۆکارە جەستەییەکان. .......................................
بەشی چوارەم:چۆنێتی ڕوبەڕو بونەوی شێوازەکانی لێکۆڵینەوە........................
پێڕست ...................................................................................

دۆزینەوەی هاوسەنگییەکی ورد لەنێوانی گرتنەبەری ڕێوشوێنە ئەمنیەکان و بەردەوامی لەکارکردندا زامنی گەیشتنمانە بەئامانجەکان - بەویستی خوا - ئەویش بەچوڵنەکردنی سەنگەری جوهدوو جیهادوو کارکردن، وە پەنا نەبردنەبەر خۆدزینەوەو وازهێنان و دانیشتن هەرچەندە قۆناغەکان سەختتروو قوربانییەکان گرانبەهاتربن. وە هەڵوێستی دروست و ڕەوا بەو شێوە دەبێت کەکارکردنمان لەگەڵ داخوازییە هەنوکەییەکانی واقیعدا بسازێنین، سازاندنێك کە ماناکانی نەبەردی و خۆڕاگری و پێچەسپاوی لەخۆبگرێت و لەهەمانکاتدا ئاوێتە بوبێت لەگەڵ هەستەکانی هۆشیاری و ژیری و چاوکراوەیدا.